**ئی زامە، ئاشارەو نێیەو!**

---

**این زخم، پنهان‌شدنی نیست!**

چیا

ناسنامەیٚ پرتووک

ناو: ئی زامە، ئاشارەو نێیەو!

کوومە هەڵبەس

وە کوردیی خوارین ( پەهلەیی ــ فەیلی، کەڵهوڕی، لەکی، گوورانی )

بڤەش: ڕێوار ئاودانان

وەشنگە: چیا

یەکم چاپ: ٢٧٢١ کوردی / ١٤٠٠ هەتاوی

وێراشت و چاپ نوو: ٢٧٢٣ کوردی / ١۴٠٢ هەتاوی

---

مشخصات کتاب

عنوان: این زخم، پنهان‌شدنی نیست!

مجموعه شعر دوزبانەی کُردی ــ فارسی

شاعر: ریوار آبدانان

نشر: چیا

چاپ نخست: ٢٧٢١ کُردی / ١۴٠٠ خورشیدی

ویرایش و چاپ مجدد: ٢٧٢٣ کُردی / ١۴٠٢ خورشیدی

## * ڕاو

سالان ساڵە
دەناو چەمەکەێ گڕگڕ لێخن و گلێک لرپەکەر ناخم
سەرگەرم مەلە کردنم.
هەر ڕوو، تاسەخواز و دەسئەڵنەگر
تا دیردەس دیرێ دچم و
ڤە قولاو پرسیارێک نوو
خوەم، خوەم ڕاو کەرم!
... ئۆ هەر ئی مەرگ ڕەنگین واژاوە،
م (ماسی سۆرەکەێ تەنیاێ ناو چەم و ڕاوکەرەکەێ)
ژیینێ.

## * شکار

سال‌هایِ سال است

در رودخانه‌ی گهگاه گل‌آلود و گاهی زُلالِ درونم

مشغولِ شنا هستم.

هر روز، مشتاق و خستگی‌ناپذیر

تا دوردستِ بعیدی می‌روم و

با قلّابِ پرسشی تازه

خودم، خودم را شکار می‌کنم!

... و همین مرگِ زیبایِ مکرّر،

به من (ماهیِ قرمزِ تنهایِ درونِ رود و صیّادش)

زندگی می‌بخشد.

## * ئاویی دۆر

تارمایی

یا شەوەێ شەوانە نییە

ئێ قڵاسییە ــ

ڕاسیی خەمناک ڕووژانەێ ئیمەس

ک هەر وە سات

پەێ دۆرییەکەت قیژنێ

ئەێ ئاویی دۆر!

ک ناوت "ئازادی"ـیە.

## * آبیِ دور

شبح
یا کابوسِ شبانه نیست
این کلاغ سیاه ــــ
واقعیتِ غمناکِ روزانه‌ی ماست
که هر لحظه
دوری‌ات را جیغ می‌کِشد
ای آبیِ دور!
که نام‌ات «آزادی»ست.

## * ساز بێدەنگی

ساز بێدەنگییم ئەز
بژنەوەم، بێ پێژەن...

## * سازِ سکوت

سازِ سکوت‌ام من

بی‌زخمه، مرا بشنو...

## * ئی زامە، ئاشارەو نێیەو!

ئەرێ لەناو بێدەنگیی ڕەها
هەڵفڕین خۆنالین کەمووتەرێ
چەوەیل خەمسەرد خەڵک
وەرەو ئاسمان ئەڵگەردنێ؟! ـــ
لە ژێر هێرش وەفر تەنیایی سەدە
ژەم نەخواز هاوار نەکەم
ئی زامە، ئاشارەو نێیەو!

## * این زخم، پنهان‌شدنی نیست!

در سکوتِ مطلق آیا
پروازِ خون‌آلود کبوتری
چشمانِ بی‌خیالِ مردم را
به سمتِ آسمان خواهد چرخاند؟! ــــ
زیر هجوم برفِ تنهاییِ قرن
از من نخواه فریاد برنیاورم
این زخم، پنهان‌شدنی نیست!

## * کەمێ مەنە وە مانگ

چیا، هەرچێ بڵێن‌تر بوو
خەمبزوێن‌ترە ـــ
چمان کەمێ مەنە وە مانگ
بڕ نەکردێیە!

## * کمی مانده به ماه

کوه، هرچه بلندتر باشد
غم‌انگیزتر است ـــ
انگار کمی مانده به ماه
کم آورده است!

## * ئەسپ چووین

ئەسپەکەێ چووین
ئێمە ڤە بنبنین دووزەخ ڕەسەن ـــ
ئاخ زاڕوویيم!
ئێمکە ڤە پاپێیا گرەک ئەژ ئی ڕێیە گلارێمن.

## * اسبِ چوبین

اسبِ چوبین

ما را به قعرِ جهنّم رساند ــــ

آه کودکی‌ام!

حالا با پایِ پیاده باید از این راه برگردیم.

## * ڤەدڵچڕ

**دەمم، ناو کەس دە ڤیرێ نییە**
**ڤە دڵم دووس چڕم!**

**دهانم، نام کسی در خاطرش نیست**

**دوست را با دلم صدا می‌زنم!**

## * نسمەێ تەریک

هەێگوا

ئی جیلەێ سەرد ناو ڕەگەل ئێمە

خین مۆنگە.

"گردیلک پڕ"ـیش ک بووێم

نسمەێ تەریکێ دێرێم!

## * نیمه‌ی تاریک

گویی

این جنبشِ سرد درونِ رگ‌هایِ ما

خونِ ماه است.

«قرصِ کامل» هم که باشیم

نیمه‌ی تاریکی داریم!

## * داک پەژارە

زەڵەت نەچوو!
ئی داکە ک ئەژ دەرز تێوڵم درەتێیە
پەژارەێکە (کوتێ ژەێ ئەنوو، کوتێ تر ئەسر)
سڕ و کوڕ
ڕێی گەلی و چەۆم گوم کردێیە!

## * شاخِ اندوه

نترس!

این شاخ که از وسطِ پیشانی‌ام بیرون زده

اندوهی‌ست (نیمه‌اش بُغض و نیمه‌ی دیگر اشک)

مات و مبهوت

راه گلو و چشمم را گم کرده است!

## * زام هەنار

ده بنچڕ تەنیایی
زیرزیرەکێ
بێدەنگی پاشنێ
ئەڵ ساتەیل ــ
ویرمانەیل
وه بێمدوو هەوگل کەن
له ژێر واران،
وه وێنەێ زام هەنارەیل پایزی!

## * زخم انار

در ژرفنایِ تاریکِ تنهایی

زنجره‌ای

سکوت می‌پاشد

بر لحظه‌ها ـــ

خاطرات

بی‌سبب عَود می‌کنند

زیرِ باران،

همچو زخم انارهایِ پاییزی!

## * دووانه

تا مەزگ سقان گیانم، دووانەێکم!
یەیٚ نسمەم هابیل و
نسمەیٚ تر قابیل.
تیرپشک نەێخسم
گەرد هەرکامێیان بکەفم، ئەوەیٚ ترەک خینم ڕشنیٚ!
باس زارووەل لفانەیٚ زەمان کەرم:
"یاێهووش" و "فراموشی".

## * دوگانه

تا مغزِ استخوانِ جانم، دوگانه‌ام!
یک نیمه‌ام هابیل و
نیمه‌ی دیگر قابیل.
قُرعه نمی‌اندازم
با هرکدام همراه شوم، آن دیگری خونِ مرا می‌ریزد!
از فرزندانِ همزادِ زمان، حرف می‌زنم:
«یاد» و «فراموشی».

## * ئەلفوبێی مەرگ

دەێرە، د ناو "ئەلفوبێ"ـیش

مین و بم کاڵینە!

قسە کەرێمن؛ ژۆن و ئێش ڤارێ

نیسنێمن؛ کارەسات و هەواڵ دڵتەزن کەفێ ئەڤ ڕێ

خۆنێمن؛ جهانێ گڕە گرێ.

ئەڤبڕەسن ئەژ بێدەنگیی ئی ڤڵات ئاخینداخین و خەمبارە!

دەێرە، ئەڵ پشت بزەخەنەێ هەر وشە

مەرگ کوڵە گرتێیە.

## * الفبایِ مرگ

اینجا، درونِ «الفبا» هم

بُمب و مین کاشته‌اند!

حرف می‌زنیم؛ درد و رنج می‌بارد

می‌نویسیم؛ فاجعه و خبرِ ناگوارِ تلخ جاری می‌شود

می‌خوانیم؛ جهانی شعله‌ور می‌گردد.

سکوتِ این سرزمینِ حسرت‌زده و غمناک را دریابید!

اینجا، پشتِ لبخندِ هر واژه

مرگ کمین کرده است.

## * زوان بەرد

کۆەگانیش کەفتنەسە وەر گولە ـــ

خوەزەو چەسپ زام

لە زوان بەردەیل ئەوبڕەسیاتا!

## * زبانِ سنگ

کوه‌ها هم گلوله خورده‌اند ـــ

ای کاش چسبِ زخم

زبانِ سنگ‌ها را می‌فهمید!

## * هادەێ، بەرجد وشەێ تاریک و لێڵێکە!

ـ "هاتێ"!

لەی وشەێ بۆچگە

بگدەێ هەس و مەڵهەمێ

هیواێ هەس و هەراسێ

بانانێ هەس و هۆچکاتێ

... وە دڵنەرمی ژیینێ و وە دڵڕەقی کوشێ!

## * شاید، قطعا واژه‌ای گرگ‌ومیش است!

ــ «شاید»!

در این واژه‌ی کوچک

خنجری هست و مرهمی

امیدی هست و هراسی

آینده‌ای هست و هیچ‌گاهی

... مهربانانه حیات می‌بخشد و سنگدلانه می‌کُشد!

## * تەقەیٚ شەنگیٚ ئەژ گوپ سەردوسڕ فێڵ!

**تاکەگلیٚ**

**زەردەخەنەیٚک بڵنگیی دیڤارەل زندان دیاری کەریٚ و**

**لاوەنن، دووە پڵتووکەیٚ**

**تا چوارپاێەکەیٚ ژین ئەژ ژێر پات فڕ بیٚ.**

**ئەڤ ماچ گەرمە، تەقەیٚ شەنگێکە**

**ئەژ ناو گوپ سەردوسڕ فێڵ**

**... تا بخوازی خوەت بییەڤ لا،**

**کوشیاینە!**

## * شلیکِ گلوله‌ای از دهانِ سرد نیرنگ!

گاهی

لبخندی ارتفاعِ دیوارهایِ زندان را تعیین می‌کند

و نوازش، تلنگُری می‌شود

تا چارپایه‌ی زندگی را از زیر پایت پرتاب کند.

آن بوسه‌ی گرم، شلیکِ گلوله‌ای‌ست

از دهانِ سرد نیرنگ

... تا بخواهی جاخالی بدهی،

کُشته شده‌ای!

## * تەنیا شوونپا

یەکڵەدار
ئەڵ پەراوێز هشکەڵەتەێ هەڵەت چووڵ
باڵاێ دەناو بڵێزەل تین و گڕۆ سووزێ.
ئەژ ڕێیەل ئاسمۆنی
بێجەژ تەپتووسێک
جیلەکەرێ نەێگوارێ.
"ــ هۆ ڕێڤارەکەێ تەنیا!
ئمێد کامین ئامانج دیر
ئشنە گڕگرتە، ڤەرەۊ نووا دەرێکەت؟"
ئەڵ ڕێیەل زەمینی
جیلەکەرێ وێیار نەێکەرێ
بێجەژ تەپتووسێ
ئۊ جاپاێ ڤرەۊ نادیار
ک بارکووڵەێ قورسێ ئەژ تین و گڕۆ
ئگەرد خوەێ ڤە کووڵ کێشێ.

## * تنها ردّپا

تک‌درخت

بر حاشیه‌ی خشکیده‌ی صحرای تهی

قامت‌اش میانِ شعله‌های شوق و عطش می‌سوزد.

از جادّه‌های آسمانی

جز گردوغباری

جُنبنده‌ای گذر نمی‌کند.

«ــ آی مسافرِ تنها!

امیدِ کدامین مقصدِ دور

تو را این‌گونه مُلتهب، به پیش می‌برد؟»

در جادّه‌های زمینی

جُنبنده‌ای عبور نمی‌کند

جز گردوغباری

و ردّپایی رو به ناپیدا

که کوله‌بارِ سنگینی از شوق و عطش را

با خود به دوش می‌کشد.

## * باڵنه و ئاوازه سۆره‌که‌ی

ئه‌ڵ په‌لێ ئه‌ژ دار ڕه‌گه‌م
باڵنه‌ی نیشتێیه
ک هه‌میشه، ئاواز سۆرێ چڕێ.
هه‌ر من و ئه‌ڵوه‌سه‌م ده‌نگێ ئژنه‌ۆێمن و
گوله‌ی (منێ ڤه ئه‌نووێ)
ک ده بلووره‌ی گه‌لیی تفه‌نگ مه‌رگ، چه‌ۆه‌ڕێیه
تا یه‌ی ڕوو باڵ بگرێ و
ده‌ناو گێژگێژاو سۆره‌ی ئه‌ۆ ئاوازه
خوه‌ی ڤه کوشت بێ!

## * پرنده و آوازِ سُرخ‌اش

بر شاخه‌ای از درختِ رگ‌هایم
پرنده‌ای نشسته است
که همواره، آوازی سُرخ می‌خواند.
تنها من و شعرهایم صدایش را می‌شنویم و
گلوله‌ای (شبیه یک بُغض)
که در نایِ گلویِ تفنگِ مرگ، چشم‌به‌راه است
تا روزی پَر بگیرد و
در غرقابِ سُرخِ آن آواز
خود را به کُشتن بدهد!

## * واقوڕی

ئەڤەیٚ ک مێیا بێیەتا، چی

ئەڤەیٚ ک مێیا درگا بچەکەنا، کپیا

ئەڤەیٚ ک مێیا ہمەنا، گوم بی

ئەڤەیٚ ک مێیا باڵ بگرتا، کەفت

چ دنیایٚ چەپیچەوارشەێکە!

تا دخوازی باڵ ئەڵماڵی و بژیی

ڤە جاڵ کەسیٚ دمری ک قەت خوەت نەڤییە.

## * بُهت‌زدگی

او که باید می‌آمد، رفت

او که باید در می‌گشود، خسته شد

او که باید می‌ماند، گُم گشت

او که باید پرواز می‌کرد، فرو افتاد

چه دنیایِ وارونه‌ای‌ست!

تا می‌خواهی آستین بالا بزنی و زندگی کنی

به جای کسی می‌میری که هرگز خودت نبوده است.

## * ئاهـ !

فەڵسەفەیٚ ڤەدی هەتن جەهان
هاتێر هەر ئیٚ "ئاهـ"ـە بوو ک مەکیشیمن ــ
هەنیٚ دارەل ئەنار، گوڵە مەکەن

## * آه!

**فلسفه‌ی پیدایشِ جهان**

**شاید همین «آه»ی باشد که می‌کشیم ــــ**

**وقتی درختانِ انار، گُل می‌دهند**

## * ئاشارئاشارەکی

چەڤەلت ک نیقەنی
م ڤەر هەێتاهەیٚ نادیارەڤ بیم.
ئاخ ئەڵنەکێش!... نەگرێڤ!...
هەڵەیٚ تو ک نەڤی
مەرگ، ئاشارئاشارەکی سەریٚ نێیەو!

## * قایم‌باشک

چشم‌هایت را که بستی

من برای همیشه غیب شدم.

آه نکش!... گریه نکن!...

تقصیرِ تو که نبود

مرگ، قایم‌باشک سرش نمی‌شود!

## * پرسیار کەڵێن

هەبوون، پرسیار کەڵێنێکە و
ئەڤین، دەمەلاڵکیی دڵێک نەسرەو
ئەڕا زانسن واوێژ!

## * پرسشِ بزرگ

**هستی، پرسشِ بزرگی‌ست**

**و عشق، تمنّایِ یک قلبِ ناآرام**

**برایِ دانستنِ پاسخ!**

## * نوقمبیینێ ک ڕەنگینە!

بنیشنەم ڤەلاێ بێدەنگییەکەت
ک ئوورە قیلترین ئقیانووس جەهانە و
دڵووپ، تەنیا ڤە نوقمبیین ستار گرێ

## * غرق‌شدنی که زیباست!

مرا کنارِ سکوت‌ات بنشان

که آنجا ژرف‌ترین اقیانوسِ جهان است و

قطره، تنها با غرق‌شدن آرام می‌گیرد

## * ئەڵشکیان گەپ

ئاو کوشتیمن
ئاگر وە دیل گرتیمن
خاک زامدار کردیمن و
هەوا شکەنجە دایمن.
لەیوا بۆ ک ئیمەێ مرۆڤ
وە تاجێک ژە خۆن سوورەگوڵ دە بان سەرمان و
بەیداخێگ لە بێدەنگیی قەناری دە قول مشتمان
بیمنە گەوراترین سەرکەفتەێ ئەڵشکیاگ کاکشان!

## * شکست بزرگ

آب را کُشتیم
آتش را به اسارت درآوردیم
خاک را زخمی کردیم
و هوا را شکنجه دادیم.
اینچنین بود که ما انسان‌ها
با تاجی از خونِ گُل‌سرخ بر سرمان
و پرچمی از سکوتِ قناری در کف‌مان
بزرگ‌ترین فاتحِ شکست‌خورده‌ی کهکشان شدیم!

## * وارشت

واریدن و

لە قوڵایی گیانم

چۆزەرە دەم

چۆ داربەڕۆ کۆەسان

ک نیوەێگ لە لێ هەڵبەس فڕینە و

نیوەێ ترەکێ لاوەلاوەێ سان ــ

ئوو ئەوین، ئاسمانێگە

ک لە ساڕووکییەگەت داکاسیاێە.

## * بارش

می‌باری و
در ژرفایِ جانِ خویش
جوانه می‌زنم
چونان بلوطبُنِ کوهستان
که نیمی از آن، شعرِ پرواز است و
نیمه‌ی دیگرش لالاییِ سنگ ـــ
و عشق، آسمانی‌ست
که در سایه‌ات آرام گرفته است.

## * ئاوێ ئەرەێ گەلیی هوشکبییەێ وشەیل

قسەێ بکە ئەێ دووس!
تەنانەت وە بیچکیی دڵ باڵندەێ دەنگ‌چڕێ
تا دارسانێک
ڕازی و قانێ ببێ
ڤە مەنن ئەڵ سەر ڕەگ و ڕیشەێ وژ.

## * آبی برای گلویِ خشکیده‌ی کلمات

حرفی بزن ای دوست!

حتی به کوچکیِ دلِ پرنده‌ای آوازخوان

تا جنگلی

مجاب شود

به ماندن بر روی ریشه‌هایِ خویش.

## * ژان

ئێ شوونپاێ بان وەفره
ئۆشێ ک چیده.
ئەو تەم تیرەێ سمنجه
ک وێنەێ پەلەوەرێگ، باڵەیلێ ڕاخستێیه تا ئەوپەڕ ئاسۆ
ئیشێ گلەو دما نیەخوەی. ـــ
هەمیشه هەر لەێوا کەمقسه بیته و
کاریگەر
وەک مەوداێ تێخێگ وە بان پووسەو
ک بڕێ و دەم سۆەر هەنارێ
تا بنچڕ ژان
ڕۆت کەێدەو.

## * درد

این ردّپای رویِ برف
می‌گوید که رفته‌ای.
آن غبارِ تیره‌ی سمج
که مثلِ پرنده‌ای، بال‌هایش را گسترده تا فراسویِ افق
می‌گوید بازنمی‌گردی. ــــ
همیشه همین‌طور کم‌حرف بوده‌ای و
اثرگذار
همچون لبه‌ی تیغی بر رویِ پوست
که می‌بُرّد، و دهانِ سُرخِ اناری را
تا ژرفایِ تاریکِ درد
برهنه می‌گردانَد.

## * پایزەچڕ

**ژۆ کەرێ، سەراپایێ ماڵەکە**

**ئاهـ ! ڤە بێ دووس...**

## * آوازِ پاییزی

سر تا به پایِ خانه، درد می‌کند

آه! بی حضورِ دوست...

